## تەوەری هەشتەم: بەشی كۆتـایی ئەم پەرتووكە:

نە تەنیا مرۆڤ بەڵكو تەواوی گیانلەبەران بەهۆی ویست و ئیرادەوە دەژین و هیچ یەكی لەوانە لە (زانست و ویست و ئیرادە)و كارێ كە لەو ئیرادە و ویستەوە سەرچاوە دەگرێ، بێ بەهرە نین و هەر یەكێكیان خاوەنی خواست و بۆ گەیشتن پێی ڕێگەیەك دەگرنە بەر.

هەندێ جار لە هۆكارێكی تایبەت بەخۆی و هەندێ جاریش لە ئامراز و هۆكارگەلێ لە دەرەوەی بوونی خۆی و لە هەندێ بابەت و بواریشدا لە ئامراز و هۆكارگەلێكی دەروونی و دەرەكی پێكەوە بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەكەی كەڵك وەردەگرێ.

بەگشتی سروشتی تەواوی گیانلەبەرەكان بە تایبەتی مرۆڤ بە جۆرێكە كە: داوای شتێ دەكەن و دەتوانن پێی بگەن و لە ئەستۆی دەربێن و بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستی خۆیان پشت بە شتێ دەبەستن.

ویست و ئامانجیش دوو جۆرە:

**یەكەم:** ئەوانەی كە لە خودی خۆیاندا (لە زاتی خۆیاندا) ئامانج و مەبەستن.

**دووەم:** ئەوەی كە بەهۆی شتێكی ترەوە وەك ئامانج ومەبەستیان لێ دێت. ئامراز و هۆكارگەلێ كە بۆ هاوكاریی و ئاریكاریی لە پێناو گەیشتن بەو ئامانج و مەبەستە بەكاری دێ و بە واتایەكی تر یارمەتی و دەست گرۆییان لێ داوا دەكرێت، ئەوانیش دوو جۆرن:

**یەكەم:** ئەوانەی كە لە خودی خۆیاندا یارمەتی دەروهاوكارن.

**دووەم:** ئەوانەی كە بە شوێنكەوتەوە و ئامرازی ئەو دێنە ئەژمار.

كە واتە سەبارەت بەمە چوار بابەت تەرح دەكرێن:

١. شتێ كە لە زاتی خۆیدا ئامانج و مەبەستە.

٢. كاروباری كە لە پەیوەندی لە گەڵ كاروبارهایەكی تر دەكەونە بەر سەرنجدانەوە.

٣. شتانێك كه له زاتی خۆیاندا یارمەتی دەرو هاوكاریكەرن.

٤. له پەیوەندی به ئامراز و هۆكار بوونەوە و به شێوە و جۆرێكی تر دەكەونه بەر سەرنجدانەوە.

مەبەست ئەوەیه كەوا گەر دڵی ئامانجێكی هەبێ و پێی ئاسوودە ببێت و بەدرووستی خۆشی بووێت و پێویستی به شتێكه كه بۆ گەیشتن پێی كەڵكی لێ وەربگرێ و داوای یارمەتی لێ بكات.

یارمەتی دانیش داواكراوە و بەكارهێنراوە. پەرستش و داوای یارمەتی كردن له زۆرێك له بوارەكاندا (مەسەلەكاندا) پێویست و پێویستكراوی (لازم و ملزوم) یەكترین.

هەر شتێ كه دڵ له پەیوەندی له گەڵ ژیان و گوزەران و یارمەتی دان وكەڵك و قازانجی خۆی وابەستەی بێت و دڵی پێ بدات، له بەرامبەری دا گوێڕایەڵ و تەسلیم دەبێت، ئەگەر چی له بەر زاتیشی خۆشی نەوێت، له ڕووەوە خۆشی دەوێت، بەڵام هەندێ جار باروودۆخ بەسەریدا زاڵ دەبێ و دەستی بەسەردا دەگرێت و لەبەری زات و جەوهەر و كەسایەتی (ماهییەتی) خۆشی دەوێت و ئەو ئامانج و مەبەستەی كه لێی هەبووە فەرامۆشی دەكات.

هەندێ جار دڵ شتێكی خۆش دەوێت و به ئامانج و مەبەستی خۆی له قەڵەمی دەدات و دەیژمێرێ، بەڵام داوای یارمەتی و هاوكاری لێ ناكات و بۆ گەیشتن پێی پشت به شتێكی ترەوە دەبەستێ. وەك كەسێ كەوا كەماڵ، پلەو پایه یاخود ژنێكی خۆش بووێت و گیرۆدە و عەودالی ببێت، ئەگەر بزانێ دڵدارەكەی (معشوق) توانای فەراهەم كردنی ئامانج و مەبەستی ئەوی هەیە، پشتی پێ دەبەستێ و لەم كاتەدا و بەم شێوەیە (خۆش ویستن و یارمەتی دانی) ئەو لەسەر یەك ئامانج و مەبەست كۆ دەبێتەوە. له ئەنجامدا مەسەلەكه چوار تەوەر پەیدا دەكات:

یەكەم: خۆشەویست و دڵدارێ كه لەبەر زات و نەفسی خۆی، هەم خۆشەویست و هەمیش یارمەتی دەر دەبێت، ئەمە بەرزترین و گەورەترین جۆرە و هیچ كەس و هیچ

شتێ جگە لە پەروەردگار (جلّ جلالە) بەم جۆرە نییە و جگە لەو دەبێ لە پەیوەندی لەگەڵ خۆشویستنی ئەودا ببنە خۆشەویست و وەك ئامراز و هۆکار یارمەتی و هاوکارییان لێ وەربگیردرێ.

**دووەم:** شتێ کە بەهۆی زاتی شتێکی ترەوە خۆشەویستە و داوای یارمەتیشیان لێ دەکرێ، وەك دڵدارێ کە توانای ئەوەی هەبێ کەوا ئامانجی خۆشەویستەکەی (عاشق) بەجێ بهێنێ.

**سێیەم:** خۆشەویست و کە بۆ گەیشتن پێی، لە کەس و شتێك داوای یارمەتی بکرێت.

**چوارەم:** هاوکار و یارمەتی دەرێ کە داوای یارمەتی لێ کراوە، لەبەر خاتری خۆی نییە کە ببێتە خۆشەویست.

کاتێ کە ئەم کاروبارانە بناسرێن، ئاشکرا دەبێت کە، کامە لەم چوار جۆرە شایانو شایستەی (بەندایەتی و داوای یارمەتی کردنیان) هەیە و خۆش ویستن و داوای یارمەتی کردن لە غەیری ئەو ئەگەر هۆکارێ نەبێ بۆ خۆش ویستن و یارمەتی دانی ئەو دەبێتە مایەی زەرەر و زیان و شەڕ و خراپەی مرۆڤ و زەرەر و زیانی لە کەڵك و قازانجی زیاترە.

پێویستە لە کۆتایدا بڵێم: "هەرچی کەموکوڕی و ناتەواوی وخەوش و نیازمەندی هەیە، لە پەروەردگاری گەورە و زانا و کاربەجێ و بێ نیاز و بە دەسەڵاتەوە دوورە و تەواوی و کامڵی و بێ خەوش و غەشی و بێ کەموکوڕی تەنیا بۆ ئەوە و بەس".

وەرگێڕ

٢٠١٠/٧/٢٤زاییینی (خورماڵ)

١٢/شعبان/١٤٣١کۆچی

# ناوەڕۆك